حکومەتا هەرێما کوردستانێ – عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# مافێن مرۆڤی

## بۆ پۆلا حەفتێ بنەڕەت

**دانان**

حەمەد سالم حەمە ئەمین    جێنەر عەلی جولا

**چالاکی**

عەبدولا مەحمەد ئەمین    رەحیم سلیمان

ئەمەل جەلال محەمەد

**پێداچوونا زانستی**

یوسف عوسمان حمد

**وەرگێران**

لیژنەیەکێ ژ رێڤەبەریا گشتی یا پەروەردا دهۆکێ ژ زارێ کرمانجییا خوارێ ئینایە سەر زارێ کرمانجییا ژووری

چاپا حەفتێ    ٢٧١٥ کوردی    ٢٠١٥ زایینی    ١٤٣٦ مشەختی

# دەسپێك :

مافێ مرۆڤی ب مرۆڤی ڤە گرێدایە، یاسایا سروشتی ودانانڈی و ئاینێن ئەسمانی کرینە ژێدەر بۆ خۆ، هەکە ئەڤ مافە د هندەك بار و دەماندا د رەها نەبن و سنوور بۆ هاتبنە دانان بۆ بەرژەوەندیا کۆمەلێ، ئەڤەژی د بەرژەوەندیا مرۆڤی بخۆدایە، ژبەر پێدڤیەکا کۆمەلایەتی دا بشێت دگەل مرۆڤێن دیتر ب ئاشتی و برایینی بژین. هەرچەندە حەتا ڤێ گاڤێ پێناسەکا گشتی یا ئێك لا بۆ مافێ مرۆڤا نەهاتیە دانان، بەلێ ئەم دشێین بێژین (مافێ مرۆڤی پیڤەرێ سەرەکی یێ گەلیە و کەسەك نەشێت بێی وی ژیانەکا پر سەرومری و ژ هەژی ببەت).

مرۆڤایەتی بخۆ بناغێ دادومریێ و ئاشتیێ یە رێزگرتن ل مافێ مرۆڤی پێشکەفتن و ومرارا تەمام ب کەسایەتیا تاکەکەس و کومێ ددەت. ئەو تشتێ مرۆڤ ب مافێ خۆ دزانیت پێدڤیە بۆ بەرامبەری خۆ ژی ب وی چاڤی بەرێ خۆ بدەتێ. ئانکو ئەم دشێین بێژین ماف (هەموو ئەو بەرژەوەندینە کو پێدڤیە رێزێ لێ بگرین یان ئەو بەرژەوەندینە کو لدویف یاسایێ دهێنە دان و پاراستن).

# قوناغێن مافێ مرۆڤی

ل دەسپێکێ کۆمەڵ ژ چەند خێزانا پێک دهات، کیشک ژوان خودان دەسهەلات و هێزبا، فەرمانێن وان جهێ یاساییێن ئەڤرۆ دگرتن رووداناهەر ئاریشەکێ دناڤ کۆمەڵێدا دبرنە لایێ وی و بریارێ دا لسەر دەت، کو کەسێ مافێ نەرازیبوونێ نەبوو، ب بەرفرەهبوونا کۆمەڵێ دەسپێکێ بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا هۆزا (عەشیرەتا). خودان دەسهەلاتا ناڤێ سەرۆك هۆزیان عەشیرەت لێ دنا. دەمێ چاندن و برێڤەبرنا هۆکارێن بەرهەمی پەیدابوین، و مرۆڤێن خورت و ستەمکار ل دویف تیتالا (عادات و تقالید) کۆمەڵ برێڤە دبرن، و بارا پتر هزرا وان ل بەرژەوەندیێن وان بوو نەك بەرژەوەندیێن گشتی.

ئاشکرایە کۆ مرۆڤ بخۆ گیاندەرەکێ کۆمەڵایەتیە، دگەل کۆمەڵێ دژیت، پێدڤی ب رێکخستنێ یە، ب پەیدابوونا کۆمەڵێن دەسپێکی و بەرفرەهبوونا بنەماییێن سەرەکی یێن ژیانێ، بەرژەوەندی و دەسهەلات پەیدابوون و بۆنە ئەگەرا ململانێ دناڤبەرا مرۆڤ و مرۆڤی دا، بۆ بدەستڤەئینانا ڤێ دەسهەلاتێ و پاراستنا بەرژەوەندی پەیدابوون، هندی شیابان ئەڤ ململانە گەرمتر لێ دکر، ل ڤێرێ بێنڤەدانەکا زۆر دژی مافێن سەرەتایی و سروشتیێن مرۆڤی هاتە کرن، وەکی چەوا پەیوەندیێن مرۆڤی ب چەند قوناغا دا بۆرین، قوناغا (بەری، چاندنێ، پیشەسازی... هتد) مافێن مرۆڤی ژی هەر ب وی شێوەی ب چەند قوناغێن سەرەکی دا بوورین، هەر ئێک ژ ڤان قوناغا کارتێکرنا خۆ لسەر ژیانا مرۆڤی هەبوو... گرنگیا مافێ مرۆڤی ب رادەکێ، بەردەوام جهێ پیتەدانا هزرمەند و فەیلەسوف و ئایینداروسیاسەتمەدار و کۆمەڵناس و یاساناس و ئابووریناسان بوون، هەر ئەوانژی وەکر لسەرانسەری جیهانێ و ل چەند لایان دەنگێ پارێزگاریا مافێ مرۆڤی بلند ببت، ل هەر سەردەمەکی لدویف دەمێ خۆ بزاڤ هاتیە کرن بۆ پاراستنا ڤی مافی.

ئەو قوناغێن مافێ مرۆڤی تێدا بووری، لدویف چاوانیا برێڤەبرنا کۆمەڵگەها هاتینە دابەشکرن و پێک هاتینە ژ:

- قوناغا تیتالا (عادات و تقالید).
- قوناغا یاسایێ.
- قوناغا دستووری.
- قوناغا نیڤ دەولەتی بوونێ.

# ڤوناغا نیتالان

قوناغ، لدویف چەوانیا رێکخستنا پەیوەندیان دناڤبەرا ئەندامێن کۆمەڵێدا برێڤە چوویە. پەیوەندییێن خودان هێز، کو دەسهەلاتەکا مەزن (رەها) د کۆمەڵا خۆدا هەبوو و دانابوو، کو لسەر هەمویان سەپاندبوو و ژ وێ پترتر کەسێن دی مافێ دانانا ڤان رێ و جها نەبوو و کەس نە د شیا ژێ دەرکەڤیت و بوونە تیتال بۆ کۆمەڵگەهێ، ئەڤ تیتالە مان ژ بەرەبابەکی بۆ بەرەبابەکێ دی و مافێ مرۆڤی ل ڤێ قوناغێ ب شێوەکێ بەرفرەهـ هاتبوو پێشبینکرن و لاوازبوون و ئەو کەسێن بەرگری ژێ دکر گەلەك دکێم و بێ دەسهەلات بوون نەدشیان سنورەکێ بۆ ڤان بنپێڤەدانان ب دانن. ل ڤێ قوناغێ (کولەداری) کارەکێ سروشتی و ئاسایی بوو، بۆ مرۆڤێ زەلام و ژن و بچووك، مافێ وان برەنگەکی هاتە بنپێڤەدان و خارن و بەرە بەرە گهورین ب سەر ڤان پەیوەندیان دا هاتن. ژ بەر کو ئەو رێنماییێن دەسهەلاتدار لدویف ئاریشە و ریدانێت رۆژانە کێم و زێدەبوون. ئەڤە ژبلی ئەو گهورینێن پەیدابوین ژ ئەگەرێ مرنێ، ئان هەر تشتێ دی ب سەرێ دەسهەلاتداران هاتبیت و ئەو کەسێن پشتی وان ب حەزا خۆ گهوری د رێنماییێن بەری خۆ دا کربیت، وی دەمی نڤێسین نەبوو کو تیتالا بنڤێسن دا کێمترین گهورین ب سەردا هاتبان و بەرەباب لدویف بەرەبابی لدویف چووبان و ژ بیر نەکربانە. ئەڤ قوناغە بۆ دەسپێکا پەیدابوونا کۆمەڵێ هەتا زانینا نڤێسینێ ڤەدگریت و جودایەکا چینایەتیا زۆر تێدا دهێتە دیتن و کۆمەڵ بۆ چەند چینێن جودا جودا هاتە دابەشکرنن. کولەداری ژ هەمویا نزمتر و بێ بەهرتر بو و چینا ئوروستوکراتی بلندترین چین بو و کومەکا مافان وەك مافێ

(ژیانێ - مولکداریێ - هەبوونا کولا - پێکئینانا خێزانێ ... هتد) شیان بۆ کەسێ خۆ ڤان مافا پەیدابکەن. مافێ وانا وەکی تیتالا هاتنە پەیرەو کرن و نە بشێوەکێ یاسایی هاتبوونە دارشتن، لەوما گەلەك یا ب ساناهی بوو هەر ئێک ژ ڤان مافا بهێنە بنپێڤەدان.

## ڤوناغا یاسایێ

دکەڤندا، یاسا ژێدەر ژ تیتالا هەلدگرتن. دویفدا ژ ئەگەرێ پێشڤەچوونا شارستانیەتێ و رێکخستنا پتر یا کۆمەلێ و ب هێزبوونا دەولەتێ، دەولەتێ ب خۆ یاسا ددانا و دنڤیسی. ب هاتنا یاسایێ قوناغەکا نوی‌و یا مافێ مرۆڤی دەسپێکر، ئەوژی قوناغا یاسایی یە. دانانا یاسایێ ل دەسپێکێ تشتەکێ سەرڤەیی بوو کو ئەوژی نڤێسینا تیتالا بوو. جارەکا دی دارشتنەکا دی یا هەروان تیتالا بوو. بەلێ ب رەنگەکێ دی و دەستکاریەکا بەرچاڤ، بڤێ چەندێ ژی خەلک ب بەندێن یاسایێ ڤە گرێدابوون. بۆ نمونە یاسایێن حەمورابی ب کەڤنترین یاسا دهێنە دانان، حەمورابی دو هزار سالان بەری زایینێ پاشایێ بابل بوو، یاسا دانایە، و لسەر بەری نەخشاندبوو. یاسایێن وی نڤێسین تیتالێن بەلاڤێن سەردەمێ وی بوون. ئەڤ بابەتە بخۆڤە گرتبوون: سزادان، شوونکاری، دەستگرتن، کولەداری، خێزان، رێکخستنا کرین و فروشتن و ڤەگوهاستنا کەل و پەلا... هتد. سزادان د یاسایێن حەمورابی دا گەلەك ب ستەم و گران بوون، سزایێ هەر ئێک ژ: (نەوەیی ❖، دزی،

❖ نەوەیی: ئەوە یێ ژ درەو تشتەکی ب سەر ئێکی ڤەنیت.

دەهمەن پیسی (زناکرن)، رەڤاندن و ڤەشارتنا مروڤان) سێدارەدان بوو. ڤان یاسا گەلەك حساب بو مولکایەتیێ کربوو.

نموونەکا دی ژ یاسایێن نڤیسی دناڤبەرا سالین (٦٤٠ - ٥٦٠) بەری زایینێ، زەلامەکێ هوزانڤان زانایێ ئەغریقی، بناڤێ (صولونێ ئەغریقی) یونانیان هەلبژارت و کرە حاکمێ خو، چەند یاسایەك بو بریڤەبرنا دەولەتێ دانان، بریار دا چ دەیندارەکێ گرتی هەیە بهێتە بەردان، و نەهێلا دەیندارا بکەنە کولەدار، هندەك میراتە بو ژنا دەستەبەرکر، ئەرد و جوتیارێن بندەست رزگارکرن، جڤاتەکا (٤٠٠) کەسی ژ (٤) هوزێن بازێرێ (ئەسینا) پێکئینا، دادگەهەکا دەسپێکرنێ دامەزراند.
د نیڤەکا چەرخێ پێنجێ بەری زایینێ دا جڤاتا پیرێن روما لیژنەکا دەھ کەسی ژ شارەزایان دامەزراند، ماوێ (٢) سالا بو دیارکر، بو کومکرنا هەموو تیتالێن بەر بەلاڤێن رومانیا، پشتی کومکرنێ هەموو لسەر (١٢) تابلوییێن (سفری) نەخشاند و ناڤێ وێ کرە (یاسا ١٢ تابلو).

# قوناغا دستوری

پەیڤا دستور، کو عەرەب بۆ یاسایا بنەرەتی بکار دئینن، پەیڤەکا فارسیە رامانا وێ (کۆمەلە یاسایێن شاه) دگەهینیت، رۆژئاڤایی پەیڤا (کونییستیتیوشن) بۆ دانایە، کو ئەوژی پەیڤەکا لاتینیە رامانا وێ (فەرمانێن ئەباتیرێن روم)یێ یە. ژ ئەگەرا پێشکەفتنا هۆزێن مرۆڤایەتی و روودانا ب دەهان شورەشێن ئازادیخوازی، ژ بۆ ئازاد کرنا مرۆڤان دژی مرۆڤێن ستەمکار سەرهلدا، مافێ مرۆڤی د دستورێ چەند وەلاتان دا جهێ خۆ یێ گونجای گرت. ل سالا ١٢١٥ ژ ئەنجامێ سەپاندنا باجەکا زۆر لسەر هەڤوەلاتیێن ئنگلتەرا، ماقیل و زانایێن ئایینی رابوون ب راپەرینەکا دژی دەسهەلاتداریا ئنگلتەرا، لسەر دەمێ (یوحنا) ی و نەچارکر کو داخازیێن وان قەبوول بکەت و بدەتێ، باوەرنامەکێ ژی ئیمزا کەت، کو ب ناڤێ (باوەرناما مەزن) ناڤدار بوو، د مێژوویێ دا ب (ماگناکارتا) دهێتە نیاسین. ژ ئەگەرێ پەیدابوون و بەلاڤبوونا پیشەسازی، شورەشەکا مەزن د ژیانا ئەورووپیاندا ب تایبەتی و د دنیایێ دا ب گشتی پەیدا بوو، گوهۆرینێن مەزن ل دنیایێ پەیداکرن. هەر د وی سەردەمیدا مێرخاسێن نڤێسەر و هونەرمەند و زانا ب بەرهەمێ خۆ یێ چر و پر دونیا هژاند و دەلیڤە خۆشکر بۆ پاراستنا مافێ مرۆڤی. ژ بەر ئەگەرێ ڤێ چەندێ پتریا وەلاتێن ئەورووپا پاراستنا مافێ سەرەکی یێ مرۆڤی د دستورێن خۆ دا دانا... ل سالا ١٧٧٦ سەربەخۆیا ١٣ ویلایەتێن ئەمریکا هاتە راگەهاندن، د دستورێ وانژی دا مافێ مرۆڤا ب ڤی جۆری هاتە راگەهاندن (مە باوەریا هەی مرۆڤ دەمێ ژ دایکا خۆ دبن، د ئازادن ئو ئەم دزانین کو خودێ کۆمەلەکا مافا یا دایێ ناچێبیت دەستیوەردان تێدا بهێتە کرن، ژوان ژی مافێ ژیانێ و سەربەستیێ و خەباتکرن بۆ ژیانەکا

خوّش (ڤێجا لدویف شیانان مافێ مرۆڤی پتر د دستوریّن وەلاتێن جودا جودا جهێ خوّ دکر ب تایبەتی پشتی شورەشا فەرەنسا، کو ل تیرمەها ١٧٨٩ز رویدا. لەوما ئەڤ قوناغا مافێ مرۆڤی ب قوناغا دستوری هاتە دان.

## قوناغا دەولەتبوونێ

ژ ئەگەرێ ب هێزبوونا پەیوەندیا دناڤبەرا دەولەتا دا و پێدڤیا وان ب ئێک و دو کاودانەکێ نوی ل دونیایێ پەیدابوو، تێکەلبوونا گەلێن دونیایێ و ئالوزبوونا بەرژەوەندیێن وان و پەیدابوونا شورەشا پیشەسازی گەلەك گهورین هاتنە کرن. بەری هەموو تشتان ژی ب ساناهیکرن و کورتکرنا دووریێ دناڤبەرا وەلاتاندا. ئوتومبێل و شەمەندەفر و فروکا و پاپوران، رێکێن درێژ بوّ خەلکی کورتکرن و بوّ سەفەرێ و بازرگانیێ پالدان. نەبوونا کەرەستەکی ل وەلاتەکی و هەبوون ل جهەکێ دی بازار گەرمتر لێکر و تێکەلبوون پترتر پەیداکر. هەر ئەوێ ژی کەلتوریّن جودا جودا تێکەلی ئێک دو کرن و چ کێم و چ زوّر کارتێکرنەك لسەر وان گوهوّرینا هەبوو، کو ل هندەك وەلاتاندا رویدا. دبیت ژێک نێزیکبوونا گەلێن دونیایێ هەموو ب چاکی نە هاتبیتە ئەنجامدان لسەر خێر و بێرا هندەك وەلاتا، بەرژەوەندی و ململانێ کەفتە لناڤبەرا دەسهەلاتدارا و چەندین شەرێن سار و گەرم ژێ پەیدابوون.

ژ ئەنجامێ ڤان پێکدادانا مەزنترین بن پێڤەدانا د مافێ مرۆڤاندا پەیدابوو. د گەرمەگەرما ڤان شەرا دا ب هزاران دەنگێن نەرازیبوونێ دژی وێ بنپێڤەدانامان بلند دبوون... سەرهلدانا چەند شورەشەکان ل ئەوروپا یا پیشەسازی و پێشکەفتن و گهورین ب سەر سیستەمێ رێڤەبەریا وەلاتێن خوّ دا ئینا .

ب دوماهیک هاتنا هەردو شەرێن جیهانی، ب هەموو ئەو کوشتنا رووداى، دەنگێ مرۆڤایەتیێ پێکڤە بلند بوو و داخازا دووبارە نەبوونا ڤان کارەساتان کر. ئەڤ هەردو شەرێن جیهانی و هەموو شەر و لێککەفتن، کارەساتێن مەزن یێن مرۆڤایەتی ل وان دەڤەرادا پەیدابوون، ئەوێن دبۆنە گورەپانێن شەری و مرۆڤ دبۆنە سووتەمەنی بۆ ڤان شەرا.

ئەڤجا مرۆڤ هەر رەنگ یان هەر زمان یان هەر نەتەوەك و ل هەر جهەکی بیت، بۆ هەیە دەنگێ داخازا یەکسانیێ د ناڤبەرا مرۆڤاندا بەلاڤ بکەت. رێکخراوا نەتەوەیێن ئێکگرتی ل سالا ١٩٤٥ هاتە دامەزراندن، سالا ١٩٤٨ هەروێ رێکخراوێ (جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی) ژ ٣٠ بەندێن سەرەکی دارێشتن و بوو ژێدەرەك و دەرگەهەك بۆ بەرەڤ پێشڤەچوونا مرۆڤایەتیێ ب شێوەکێ گشتی و پاراستنا وان مافا ب شێوەکێ تایبەت، هەرچەندە ئەڤێ جارنامێ دەولەت پێگیرنەکرن بۆ بجهئینانا وێ. بەلێ گەلەك جارا گازندا توند و تیژیێ رێکا زێدەگاڤیا لسەر مافێ مرۆڤی یا گرتی، گڤاشتنەکا توند ژی یا ئێخستیە سەر بۆ چارەکرنا بارێ مافێ مرۆڤی ل وەلاتێن واندا.

پشتی دەرکەفتنا جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی پتر پیتە ب مافێ مرۆڤی هاتە دان و هاتە چەسپاندن و لسەرانسەری جیهانێ، ب دەهان کونفرانس گێران ب سەدان پەیماننامە بەلاڤکرن ژ وان ژی:

رێکەفتننامە سالا ١٩٤٩ ل جنیف.

پەیماننامە مافێ مەدەنی و سیایی سالا ١٩٦٦.

هەر د وێ سالێدا (١٩٦٦) رێکەفتننامەیەکا دی دەربارەی مافێ ئابووری و کۆمەلایەتی و رەوشەنبیری هاتە مورکرن.
گرنگترین خەسلەتێن ڤێ قوناغێ پێکهاتبوون ژ:-
١- تایبەتمەندیا دەڤەراتیێ و هەرێمایەتیێ هاتە شکاندن و مافێ مرۆڤی بەرەڤ جیهانیبوونێ ڤە بر.
٢- بەرفرەهکرن و پێشڤەبرنا خەلەکێن هشیاریێ و پترکرنا تێگەهشتنا مافێ مرۆڤی.
٣- سەرهلدانا بنەمایێن نیڤ دەولەتی بۆ بدەستڤەئینانا مافێ مرۆڤی و سەرەدەری کرن دگەل بنپێڤەدانا مافان و چاڤدێریکرنەکا هویر لسەرانسەری جیهانێ.
٤- دامەزراندنا چەند رێکخراوێن جیهانی یێن مافێ مرۆڤی بۆ مەرەما چاڤدێریکرن و شەهمزارکرنا بنپێکرنا لسەرانسەری جیهانێ ژ وان:
رێکخراوا لێبورینا نیڤ دەولەتی (ئەمینستی ئینتەرنەشینال)، بارەگایێ وێ یێ ل لەندەن و ل زۆریا وەلاتێن جیهانێ ب ملیونا لایەنگیرێن هەین. سالانە راپورتا دەربارەی وان بنپێڤەدانان دەردئێخن کو لسەرجەم دەولەتێن جیهانێ دا دهێنە کرن.
رێکخراوا چاڤدێریا مافێ مرۆڤی یا جیهانی (هیومان رایتس ووچ) ل بارەگایێ وێ ل ئەمریکا یە و پتریا وەلاتێن جیهانێ لایەنگیر هەنە، هەرسال راپورتا دەربارەی وان بنپێڤەدانان دەردئێخن کو لسەرجەم دەولەتێن جیهانێ روو ددەن و چاکترین (باشترین) راپورت ب ناڤێ جینوسایدە، دەربارەی کێشا ئەنفالا دەرئێخستیە ئەو راپورتە بۆ پتریا زمانێن جیهانێ وەرگێرایە و ب زمانێ کوردی و عەرەبی ژی هەیە.

ڕێکخراوا فرەنسا ئازاد (فرانس لیبەرتی)، بارەگایێ وێ ل فەرەنسایە، ژ بلی مافێن مرۆڤی هاریکارییێن مرۆڤایەتی پێشکێشی گەلێن لێقەومی دکەت.



## ڕاهێنان

١- مافێ مرۆڤی ب چەند قوناغا دا بۆریە؟
٢- نوکە ئەم د چ قوناغا مافێ مرۆڤی داینە؟
٣- قوناغا بەری هاتنا نڤیسینێ کیشکە، کەنگی دەستپێ دکەت؟
٤- ئەرێ یاسا بۆیە پشتەڤان بۆ مافێ مرۆڤی؟
٥- قوناغا دستوور و یاسا چ جوداهی هەیە ژ لایێ پاراستنا مافێ مرۆڤی ڤە؟

# مافێ ژيانێ

ئێك ژ وان مافێن بنەرەتيێن كو ب مرۆڤی ڤە نيسيايە، نابيت چ كەس و لايەنەك ژ بەر هەر ئەگەرەكێ بيت وی مافی ژ مرۆڤی بستينيت، ئەڤ مافە د پرانيا رێككەفتننامە و پەيماننامێن نيڤ دەولەتی دا دوبارەكريە، هەروەسا لسەر ئاستێ نيشتيمانی ژی وەلاتا ئەڤ مافە د ياسا و دستوورا دا چەسپانديە، ئاينێن ئەسمانی ژی پيروزيا مافێ ژيانێ سەلماندیە و توندترين (بهێزترين) سزا بۆ ئەوێن ڤی مافی بن پێ دكەن دانايە.
ئەڤ مافە بۆ سەرجەم مرۆڤان دوبارەكريە بێ جوداهيا دناڤبەرا مرۆڤەكی و مرۆڤەكێ دی دا، بنپێڤەدانا ئەڤی مافی ل چەند بوارەكان دەردكەڤيت وەكی پەيدابوونا شەران كو تێدا مرۆڤ دبوونە قوربانی و سووتەمەنيا وان شەران، ئێدی چ لەشكەر يان خەلكێ سڤيل بن، بەشداری د شەريدا كربيت يان نە، هەروەسا دەمێ مرۆڤ تاوانا كوشتنێ ئەنجامددەت دبيتە بن پێكەرێ ڤان مافان ژ بەر هندێ دێ بينين د ياسايان دا دژوارترين سزا بۆ كوژەكا دانانە، هەروەسا سزايێ ل سێدارەدانێ ل هندەك وەلاتان دهێتە بكارئينان لێ ل پرانيا وەلاتا هاتيە راگرتن، چونكە سزايەكێ توند و نە مرۆڤايەتيە، نابيتە رێيا چاككرنا گونەهباران و ل دەمێ بجهئينانا ڤی سزايی ب چەوتيڤە د شياندا نينە ئەڤ چەوتيە بهێتە راستڤەركن ڤە و ژيانا بێ گونەهەكێ ب چەوتی ئەڤ سزايە لسەر هاتيە سەپاندن بهێتە زڤراندن، ئەڤە سەرهندێ را مافێ ژيانێ ژ مرۆڤی دستينيت كو د بنچينەدا مافەكێ پيروزە و نابيت بهێتە ژێ ستاندن.

بیاڤەکێ دی یێ بنپێکرنا ڤی مافی ژ ناڤبرنا بچووکەکی یێ د زکێ دەیکێدا (ژبەربرن) کو لدویف یاسایێن ئەسمانی کارەکێ نە یاساییە، سزا هەیە و ب بنپێڤەدانەکا مەزن یا مافێ ژیانێ دهێتە هژمارتن.
بەندێ سیێ یێ جارناما جیهانیا مافێ مرۆڤی دبێژیت: (هەموو کەسەکی مافێ ژیان و ئازادی و ل خۆ دلنیابوونێ هەیە) ئانکو رێ نادەت ب هیچ گروڤەکێ مافێ ژیانێ ل چ کەسەکی بهێتە ستاندن.
بەندێ ئێکێ ژ جارنامێ دبێژیت: (هەموو مرۆڤ، ئازاد و خۆدان سەروەری و ئێکسان ژ دایک دبن) هۆش و دەروون پێ هاتیە دانێ پێدڤیە ب برایینی رەفتارێ دگەل ئێک و دو بکەن ئەڤ بەندە ژبلی مافێ ژیانێ مافێ ئازادیێ و یەکسانیێ بخۆڤە دگریت.

## راهێنان

- ئێک ب دەنگێ بلند بەندا بخوونیت.
- کی باش د بەندا گەهشتیە بۆمە بەحس بکەت؟
- د وان بەندان دا ژبلی ئازادی و سەروەری و یەکسانیێ چ دی تێدایە؟
- شێوێن بنپێڤەدانا د مافێ ژیانێ دا بهژمێرە؟

# چالاكی

ماموٚستایێ وانا مافێ مروٚڤی... وانا چارێ چوو د پولێ ڤه...
پشتی روٚژباش ل قوتابیان كری، پرسیار كر:
كێ ئەڤروٚ دەنگوباسەكێ نوو ڤێیه؟
قوتابیان هندەك ژ وان دەنگوباسان گوٚتن كو ژ تەلەفزیونێ و رادیوٚ و روٚژنامه و گوٚڤاران وەرگرتبوون...
ماموٚستا شڤێدی ل كەنالێن راگەهاندنێ چەندین دیمەنێن بترس هاتنه نیشادان، شەر و پێكدادان دناڤبەرا شەركەراندا بوٚ ئەگەرا كوشتن و بریندار بوونا هندەك خەلكێ بێ گونەه.
ماموٚستای گوٚت: ئەنجامدانا ڤان جوٚره شەر و پێكدادانا بەرامبەر مروٚڤا پنیەكا رەشا شەرمزاریێ یه ب ناڤچاڤێن شەركەرانڤه.
ماموٚستا لسەر ڤان ئاخفتنا راوەستیا و گوٚتی: ڤێ گاڤێ ئەز گەلەك دلخوٚشبووم ب ڤان قوتابیان كو ب شەڤ و روٚژ و بەردەوام گوه ل دەنگوباسان دكەن و ئاگەهدارێن رووداێن ناڤخوٚ و دەرڤەنە...
پاشی ماموٚستای چەند نموونێن دلتەزین بوٚ قوتابیان ئینان و ماموٚستای سێ گروپ ژ قوتابیان دروستكرن. گوت ڤێگاڤێ ئەز دێ هندەك پرسیاران ئاراستەی هەوە كەم... هیڤیدارم هەر گروٚپەك دناڤ خوٚ دا دانوستاندنا لسەر بكەن. دشێن ژ دەرڤەی قوتابخانێ ژ گەلەك ژێدەران پێزانینا لسەر بەرسڤا پرسیاران كوم بكەن دا بشێن

ئامادەبوویان راپورتێن وان بهێنە بژارەکرن و ژ بژارا هەمووان راپورتەکا دروست و باش دەربارەی مافێ ژیانێ ئامادە بکەین...

## پرسیار:

- ئەرێ ژ لایێ ئایینی و یاسایی مرۆڤێ تاوانبار هەر چەوا بیت چێ دبیت سزایێ کوشتنێ داننە سەر؟
- ئەرێ دشێن ل کوردستانێ دوو نموونێن رووداێن راست ژ ڤی جۆرێ تاوانان بۆ قوتابیان ئاشکرا بکەن؟

لدویف بەندێ سێ ژ جارناما جیهانی دشێن بەحسەکی زێدەتر لدور مافێ ژیانێ بکەن؟

# مافێ هەڤوەلاتیبوونێ

نیشتیمان ئێکە ژ بنەماییێن دەولەتێ، لسەر نیشتیمانی ژی مرۆڤ دژین، لەوما مرۆڤی مافێ هەڤوەلاتیبوونێ د وەلاتێ خۆ دا هەیە، ل بەندێ (١٥) ژ جارناما جیهانی هاتیە:
أ- هەموو کەسان مافێ هەڤوەلاتیبوونێ یێ هەی.
ب- نابیت مافێ هەڤوەلاتیبوونێ ژ کەسێ بهێتە ستاندن، ئان نە یێ ل مافێ گوهۆرینێ بکەت.
دروستبوونا پەیوەندیا دناڤبەرا هەڤوەلاتیبوونێ و دەولەتێ دا برێکا رەگەزنامێ دهێتە کرن کو پەیوەندیەکا رامیاری و یاساییە مرۆڤ ب وەلاتێ خۆ ڤە دهێتە گرێدان.
مرۆڤ برێکا رەگەزنامێ مافێن دی وەك مافێ مولکداریێ - مافێ وەرگرتنا کارێ گشتی... هتد ل ناڤ وەلاتێ دەستەبەر دکەت و ئەرکێن وی ژی ددانیتە سەر ستۆیێ خۆ. ڤێجا نابیت ل هیچ رەوش و دەمان دا رەگەزنامە ژ مرۆڤی بهێتە ستاندن.
مافێ هەڤوەلاتیبوونێ دبیتە ئەگەرێ دەستەبەرکرنا یەکسانیێ بۆ هەڤوەلاتیان د ماف و ئەرکان دا کو دبیتە ئەگەرێ دروستبوونا هەستێ هاونیشتیمانیبوون و پێکڤە ژیانێ ب ئاشتی و خوشتڤیا نیشتمانی.
دەمێ مرۆڤ وەلاتێ خۆ بجه بهێلیت و بچیتە وەلاتەکێ دی. ل گەل پاراستنا رەگەزناما بنەرەتیا خۆ. مافێ وەرگرتنا رەگەزناما ئەوی وەلاتی هەیە دا کو ل دوماهیکێ مافێن خۆ دەستەبەر بکەت و شادبیت ب مافێ هەڤوەلاتیبوونێ.

## چالاکی:

مامۆستا ب شێوەکێ سادە لسەر تەختە رەشی ل نیڤا سێ بازنێن جودا دنڤیسیت (کوردستان - فەرەنسا - عیراق) و لژێر هەر ئێکی ڤان رستا دێ نڤیسیت:

| کوردستان | فەرەنسا | عیراق |
|---|---|---|
| مافێ هەڤوەلاتیبونێ مافەکێ سروشتی و بنەرەتیێ مرۆڤەکیە | مرۆڤی مافێ داخازکرنا هەموو رەگەزنامێ هەیە ل وەلاتەکێ لێ بیت | مافێ هەڤوەلاتیبوونێ هەر مافەکە نابیت ب زۆری ژ هەر کەسەکی بهێتە ستاندن |

پاش داخاز ژ قوتابیان بهێته کرن لدویف حەزا وان کو ببنە هەڤوەلاتی و دابەش بن لسەر هەر ئێک ژ ڤان بازنا، ئەڤ پرسیارە بهێنە ئاراستەکرن بۆ وان:

١- مافێ هەڤوەلاتیبوونێ ل لایێ تە چ رامان هەیە؟

٢- ب چ باوەرنامە هەڤوەلاتیبوون دهێتە سەلماندن؟

٣- چ وەلتە کریە حەز بکەی ببیە هەڤوەلاتی ل ئێک ژ ڤان بازنان؟

٤- ئەرێ کەسەك یان لایەك دشێت مافێ هەڤوەلاتیبوونێ ژ ئێکی بستینیت؟

٥- ئەرێ جوداهیا (رەگەز - ئایین - نەتەوە) ل دەولەتەکێ دبیتە ئەگەرێ بێ بەهرکرنا مرۆڤی ژ مافێ هەڤوەلاتیبوونێ؟

٦- هەلویستێ تە دێ یێ چەوا بیت ئەگەر مافێ هەڤوەلاتیبوونێ ژ تە هاتە وەرگرتن؟ چ رێکا گونجای دزانی بۆ بدەستڤەئینانا ئەڤی مافی؟

# ئازادیا تاکی

ئازادیا تاکی ژ مافێن شارستانی و سیاسیێن مرۆڤی نە، ئەڤ مافە ب دو خالێن سەرەکی دهێتە جوداکرن:
ئێک: کۆمەکا مافان هەنە کو د شیاندایە ئێکسەر بهێنە بجهـ ئینان، مەبەست ژ ئێکسەر ب جهئینان و رێزگرتنا وان و پشت گوهـ نەکرنە ژ بەر کو ب هەر هێجەتەکێ بهێتە پشت گوهکرن، ترسەکا مەزن دکەڤیتە سەر تاکی و سەروەریا وی.
دوو: کۆمەکا مافان هەنە پێدڤی ب شیان و داراییەکا زۆرا دەولەتێ نینە. ب تنێ لسەر دەولەتێ ئەوە بنپێڤە نەدەن بۆ نموونە دەولەت سوزێ بدەت کەسەکێ ئازار و ئەشکەنجە نەدەت و ژ ڤێ زێدەتر چ لسەر دەولەتێ نینە.
هەر کەس د هەلبژارتنا هزر و بیرادا یێ ئازادە و نابیت کەس ب زۆری تشتەکی ب سەردا بسەپینیت کو وی بخۆ باوەریەکا تەمام پێ نینە... مافێ ئازادی و دەربرینا هزر و بیرا ئێکە ژ مافێن سەرەکی یێن مرۆڤی، هەتا رادەکێ باش پیڤەرێ دیموکراتی بوونا هەر رژێمەکا سیاسینە. مافێ ئازادیا هزر و بیرا خۆ ب خۆ ئارمانج نینە، بەلکو شێوازەکە بۆ چاککرنا کۆمەلگەهـ و هەر ئێک ژ دەزگەهـ و دەربرینێن وان یێن جودا جودا بۆ بلندکرن و پێشڤەبرنەکێ کو بەرژەوەندیا گشتی ب دەستڤە بینیت، مەرجێ بجهئینانا کۆمەلگەهەکا ئازادە... مرۆڤ یێ ئازادە بەشداریێ بکەت د هەر کۆمەلەکێ و رێکخراوەکێ دا کو بخۆ هەلبژێریت. دیسان پێدڤیە مرۆڤ لدویڤ یاسایێن دەولەتا خۆ، د هەلبژارتناندا یێ ئازاد بیت و ب چ هێجەتا ئەو مافە ژێ نە هێتە وەرگرتن. بەندێ نوزدێ ژ جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی دەربارەی وی چەندێ دبێژیت:

(هەر کەسەکی مافێ ئازادیا بیرو را دەربرینێ یێ هەی، ئەڤ مافە ژی هەلگرتنا بیرو رایە بێی خۆ تێکەلکرنا کەسەکێ دی و وەرگرتنا دەنگوباسێ و هزر و بیرا و بەلاڤکرنا وان ب هەر شێوەکی بێ خۆ گرێدان ب سنوورێ جوگرافی ڤە).

ئازادیەکا دی یا تاکی هەلبژارتنا جل و بەرگا یە. نابیت ب هیچ جۆرەکی جل و بەرگەکێ تایبەت لسەر کەسەکی بهێتە سەپاندن، رێک بهێتە دان هەر کەسەك ب دلێ خۆ جل و بەرگا بکەتە بەر خۆ. ئەو کەس بەرێ خۆ بدەتە کیڤە دڤێت ب خۆ بەرێ خۆ بدەتێ کانێ ئەو جل و بەرگ ژێ دهێت یان نە دەمێ کو د هەلبژێریت، ل هەموو دنیایێ ل دویف رۆژ و ئەو سەردەمێن کەسەك تێدا دژیت، هەر تشتەکی وەختێ خۆ یێ هەی و نابیت کەسەك ب زۆری د هەلبژارتنا تشتەکێ مودێل و د وەختێ خۆ دا بهێتە بێ بەهرکرن. دەربارەی ئازادیا هەلبژارتن و پەیرەوکرنا ئایینی پێدڤیە ئەڤ خالە بهێنە بەر چاڤکرن:

١- نابیت کەس بکەفتە بەرچ گڤاشتنان کو ئازادیا ئاین و بیرو را کێم بکەت بتنێ د وان بوارا دانەبیت کو یاسا پێدڤی دزانیت بۆ پاراستنا ئاسایشا گشتی و رژێما گشتی و تەندروستیا گشتی و رەوشتێ گشتی و مافێ خەلکێ دی و ئازادیێن بنەرەتی.

٢- نابیت ب دەستڤەئینانا ئازادیا ئایین و هزروبیرا ببنە ژێدەرەك بۆ توند و تیژیێ.

٣- نابیت ئەو ئایین و هزر و بیرێن کو زارۆك پێ بهێنە پەروەردەکرن ببیتە ئەگەرێ زیانێ بۆ زارۆکی ژ لایێ لەش و ئەقلی و وەرارێ ڤە.

## چالاکی:

ئەنجامدانا چالاکیێ (کارتا ئازادیا و بیر و را) کو ژ لایێ مامۆستا و لدویف رێبەریا مامۆستای بهێتە بجهئینان.

# مافێ پەروەردەکرن و فێرکرنێ

مافێ پەروەردە و فێرکرنێ ب مافێ تاکە کەسی دهێتە دانان، دڤێت هەر کەسەکی مافێ خاندنێ هەبیت و ب کێمی قوناغا سەرەتایی ب زۆری بیت، ژ بەر کو ئێک ژ دەردێن کوژەکێن کۆمەلگەهێ نەخوێندەواریە، مافێ خاندنێ ئێکە ژ مافێن سەرەکی و گرنگە، مافەکێ ئابووری و کۆمەلایەتی و رەوشەنبیریە، ژ بلی ڤان هەموویان د شیاندایە ب مافەکێ شارستانی و سیاسی بهێتە دانان، ژبەرکو کارتێکرن لسەر کارێ مافێن دی یێ هەی. کەسەکێ خوێندەوار بێگومان گەلەك هشیارترە بۆ ئەرك و مافێن خۆ ژ کەسەکێ نە خوێندەوار. ئەڤێن خارێ ئامازەکا سەرەکی یا مافێ خاندنێ یە:

ئێک: دابینکرن.. پێدڤیە دەزگەه و بەرنامێن خاندنێ ب شێوەکێ رێک و پێک بهێنە دابینکرن و بهێنە بەردەست کرن.

دوو: ب ساناهی گەهشتنا هەمووا بۆ وان دەزگەها، ئەوژی ب رێکا:

- ❖ جوداهی نەکرن: پێدڤیە ژ لایەکی یاسا و ژ لایەکێ دی ڤە ب کریار، خاندن بۆ هەمووا بیت و ب هیچ شێوەکی و لسەر هیچ بنەمایەکی جوداهی دناڤبەرا پەیوەندیداراندا نەهێتە کرن.
- ❖ قوتابخانە نێزیکی مال و ل جهەکێ وەسا بن کو هاتن و چوون بۆ وێ یا ب ساناهی بیت.

❖ ژ لایێ ئابووریڤە، پێدڤیە خاندنا قوناغا بنەرەتی بێ بەرامبەر بیت هەولدانا بەردەوام ژی بۆ بێ بەرامبەرکرنا ناڤنجی و ئامادەیی و بۆ قوناغێن خاندنێن بلند.

سێ: پێدڤیە دانەرێن بەرنامێن خاندنێ تایبەتمەندیا رەوشەنبیری بەرچاڤ وەرگرن، و شێوە و ناڤەرۆکا بەرنامێ خاندنێ و شێوازێ گۆتنا زانستیانە بیت و دووربیت ژ توند و تیژیێ.



جارناما جیهانێ یا مافێ مرۆڤی بەندێ ٢٦ێ بۆ مافێ فێربوونێ تەرخانکریە و تێدا هاتیە:

١- هەموو کەسان مافێ فێربوونێ یێ هەی و ب کێمی دڤێت خاندنا سەرەتایی و بنەرەتی بێ بەرامبەر بیت، پێدڤیە خاندنا سەرەتایی ب زۆری بیت و خاندنا هونەری و پیشەیی بەلاڤبکەن و وەرگرتنێ ل خاندنا بلند ب یەکسانیەکا تەمام بۆ هەمووا بیت و لدویف شیانا بهێتە بساناهی کرن.

٢- پێدڤیه ئارمانجا پەروەردێ، پێگەهاندنا تەمام بۆ کەسایەتیا مرۆڤی و موکومکرنا رێزا مافێن مرۆڤی و دوستایەتیێ ل ناڤبەرا هەموو گەلان و کۆمەلێن رەگەزی یان چاڤلێ خشاندن و دوستایەتی دناڤبەرا هەموو گەلان و گومەلێن رەگەزی دایان ئاییناندا و زێدەکرنا خەباتا وەلاتێن ئێکگرتی بۆ پاراستنا ئاشتیێ.

٣- باب و دایک خودانێن مافێ ئێکێنە بۆ هەلبژارتنا شێوێ فێرکرنا زارۆکێن خۆ.

## چالاکی:

ب هزر و بیرێن خۆ چیرۆکەکێ لسەر ئێک ژ ڤان دو بابەتێن خارێ ئامادەبکە:

١- مەتا گول ژنەکا نەخاندی و گوندیه ل ژیێ ٤٥ سالیه، ب شێوێ چیرۆکەکێ ئەگەرێن بێ بەهربوونا وێ ژ مافێ خواندنێ ل بەر رۆناهیا ڤان پرسیارێن خارێ بنڤیسه:

أ- ئەرێ ئەگەرا نەخواندەواریا مەتا گول چیه؟

ب- ئەرێ ل گوندان قوتابخانه هەبوون؟

ج- ئەرێ رێگریا خێزانێ هەبوو ل بەر گولێ کو نە چوویه قوتابخانێ؟

د- ئەرێ مەتا گولێ حەز دکر بخوونیت؟

- ئازاد كورەكە ژیێ وی (١١) سالە ل دكانەكێ كار دكەت، ل گەل ڤێژی گەلەك حەژ خاندنێ دكەت، بەلێ ژ ئەگەرا كارێ دكانێ ژ خاندنێ بێ بەهرە.

ب شێوێ چیرۆكێ ئەگەرێن بێ بەهربوونا وی ژ مافێ خاندنێ ل بەر رۆناهیا ڤان پرسیارێن خارێ بنڤیسە:

أ- بۆچی ئازاد نا چیتە قوتابخانێ؟

ب- بۆچی ئازاد كار دكەت؟

ج- ئەرێ ب بوچوونا تە چێدبیت بچووك د ڤی ژی دا كار بكەت؟

د- ئەرێ دەولەتێ هیچ هاریكاریەك بۆ ئازادی كریە دا ژ مافێ خاندنێ بێ بەهر نەبیت؟

## راهێنان

بەرسڤا ڤان پرسیارا بدە:

١- ب هزرا تە ئەگەرێن نەخواندەواریا مەتا گولێ و ئازادی ژ ئێك جودانە؟

٢- مەتا گولێ و ئازادی چ مافێن وان هاتبوونە بنپێڤەدان؟

٣- كی ژ نەخواندەواریا گولێ بەرپرسیارە؟

٤- دڤێت دەولەت چ بكەت بۆ مەتا گولێ و ئازادی هەتا ژ خاندنێ بێ بەهر نەبن؟

٥- هەلویستێ تە چیە بەرامبەر شول پێكرنا بچووكان؟

## مافێ هەڤژینیێ

بەندێ (١٦)

(أ): زەلام و ژن ئەگەر گەهشتنە ژیێ هەڤژینیێ مافێ پێکئینانا خێزانێ یێ هەی بێی کو گوهبدەنە جوداهیا رەگەزی یان ئایینی.

(ب) مەهربڕین ب رازەمەندی و سەربەستیا تەمام یا ژن و زەلامی دبیت.

(ج) خێزان یەکەکا سروشتی و بنەرەتیا کۆمەڵگەهێیە و مافێ پاراستنێ هەیە ژ لایێ کۆمەلێ و دەولەتێ ڤە.



خێزان یەکەکا کۆمەڵاتیە و کۆمەڵگەه لسەر دروست بوویە، مرۆڤ د ژیانێدا پێدڤی ب هەڤژینی یا هەی دا بەردەوام بیت، مرۆڤ دڤێت یێ ئازاد بیت ل ژێگرتنا هەڤژینیێ ب شێوەیەکی کو حەزا خۆ تێدا دیاربکەت. ژ بەر کو دبنەرەتدا هەڤژینی پێکدهێت ژ یەکگرتنا حەزا ژن و زەلامی و رازیبوونا وان لسەر پێکئینانا خێزانێ. یاسا رولەکێ رێکوپێک دبینیت د دیارکرنا ماف و ئەرکێن ژن و زەلامی دا پاشی دیارکرنا چارەنڤیسێ (بچووکا) ب رێکا چەسپاندنا ئەرك و مافێن وی.

د هەڤژینیێ دا دڤێت ئەڤ خالە بهێنە ئەنجامدان:

١- لدویف یاسایێ دەمێ هەڤژینی دروست دبیت کو رازیبوونا هەردو لابیت و توند و تیژی (تەعدایی) تێدا نەبیت، پێدڤیە ب شێوەکێ ئاشکرا و روون ژ لایێ دادگەها بارێ کەسایەتی ڤە رەزامەندیا هەردو لا دیاربکەن.

٢- ژیێ هەڤژینی دڤێت ژ (١٥) سال کێمتر نەبیت، ژ لایێ یاسایی ڤە هەڤژینی دروست نابیت ئەگەر ژ ڤی ژی کێمتر بیت.

٣- پێدڤیە تومارکرنا گرێبەستا هەڤژینیێ ژ لایێ دادگەها بارێ کەسایەتیڤە بیت.

٤- دڤێت دەولەت کارێ هەڤژینیێ ب ساناهی بکەت، و پاراستنا یاسایی بۆ تایبەتمەندیا ژیانا خێزانی ئامادە بکەت.

## چیرۆك:

قوتابخانەکا کچان ژوورا رێڤەبەری.
دەیک: رۆژباش مامۆستا.
رێڤەبەر: ژیان باش.
دەیک: مامۆستا من دڤێت کچا خۆ ڤەگوهێزم بۆ قوتابخانەکا دی، بەلکی بەلگەناما ڤەگوهاستنێ بۆ چێکەی.
رێڤەبەر: دڤێت دەسپێکێ رازیبوونێ ژ وێ قوتابخانێ بینی، پاشی بەلگەناما ڤەگوهاستنێ دێ بۆ چێکەم.
دەیک: مامۆستا من رازەمەندیا ئینای کو جھ یێ هەی.
رێڤەبەر: باشە نێ سالا خاندنێ گەلەك نەمایە، بۆچی دوماهیا سالێ دێ ڤەگوهێزی؟
دەیک: نەخێر مامۆستا، دگەل هەڤژینێ خۆ دێ جودا بم و دێ چمە مالا بابێ خۆ و کچا خۆ دێ دگەل خۆ بەم... بەری هەڤژینیێ مە ئێک و دو نە نیاسیبوو تێگەهشتن دناڤبەرا مەدا نەبوو هەتا نوکە ژینا مە شەر و نەخوشی بوو چارە نڤیسێ هەڤژینیا مە ب ژێکڤەبوون ب دوماهیک هات.
رێڤەبەر: مخابن، سوباهی دو وێنێن کچا خۆ بینە.

## ئەركێ مالێ:

بەرسڤا ڤان پرسیاران بدە:

١- خێزان چیە؟

٢- پێكهاتێن خێزانێ چنە؟

٣- بۆ دروستكرنا خێزانەكا بەختەوەر مەرجێن هەڤژینكرنێ كیشكن؟

٤- ئەرێ رێزگرتن ل راو بۆچوونێن ئێك و دو مەرجەكە بۆ بەردەوامیا خێزانا بەختەوەر؟

٥- ئەو خێزانا هەردەم شەر و نەخوشی تێدابن ئەنجامێن وێ چنە؟

٦- تە هزرا خۆ كریە، ل پاشەرۆژێدا چەوا دێ هەڤژینا خۆ هەلبژێری؟

# پاراستن ژ توند و تیژیێ

بەندێ (٥):
چ مرۆڤەك ناهێتە ئێشاندن و ئازاردان و كریارێن توند و تیژیێ و نە مرۆڤانە و هەتك برنێ دگەل نا هێتە كرن.



هەموو كەسان مافێ پاراستنێ ژ توند و تیژیێ و سەرەدەریێن نە رەوا هەیە. چ دەسهەلات بكەت یان ژ لایێ مرۆڤەكێ دی ڤە بهێتە كرن، بتایبەتی بكارئینانا ئازاردانێ و سەرەدەریا نە دروست دژی كەرامەتا مرۆڤی، دڤێت یاسا مرۆڤی ژ توند و تیژیێ بپارێزیت. هەر مرۆڤەكێ توشی توند و تیژیێ ببیت مافێ هەی هەوارێ ببەتە بەر دادگەهێ لەوما دەست برن بۆ كارێ توند و تیژی و بكارئینانا هێزێ دژی مرۆڤی ب گونەه دهێتە دانان. بكارئینانا

شێوازێن نه یاسایی بۆ وەرگرتنا پێزانینا و باوەریکرن (اعتراف) و دروستکرنا باروودوخەکێ ب ترس و خورتی لێ کرن ب مەرەما پالدان بۆ وەرگرتنا رەزامەندی لسەر کارەکی ب بنپێڤەدانا ئەڤی مافی دهێتە دانان.

ئێک ژ جۆرێن توند و تیژیێ پێکهاتیە ژ کریارا ئازار و ئێشاندنێ کو ب بنپێڤەدانا سەرەکیا مافێ مرۆڤی لسەر دهێتە هژمارتن. ل دەمێ زیندانکرنێ و دەست ب سەر داگرتن دهێتە ئەنجامدان لسەر کەسێ زیندانکری یان لایێ سێ (ئانکو ئازاردانا کەسەکێ دی نێزیک ل کەسێ زیندانکری ب مەرەما وەرگرتنا پێزانینا ژێ) ئەڤ کریارە پێکهاتیە ژ هەر کارەکێ ب مەرەم کو ببیتە ئەگەرا ئازاردانا کەسەکێ دیارکری چ ژ روویێ لەشی یان دەروونی بیت، کو ئەوێ ب کارێ ئازاردانێ رادبیت مەرەم پێ.

- وەرگرتنا پێزانینان یان باوەریدان وەرگرتن ژ وی یان کەسێ سیێ.
- ئازاردان لسەر کارەکی کو وی یان لایێ سیێ کربیت یان گومانا کرنا وان هەبیت.
- ترساندن و نەچارکرنا وی یان لایێ سیێ.

## راهێنان

- چێدبیت چەند شێوازەکان ژ توند و تیژیێ بنڤێسی؟
- ئەرێ تە باوەری ب توند و تیژیێ هەبوو بۆ برێڤەبرنا کارێن خۆ؟
- ئەرێ مامۆستایێن تە توند و تیژیێ بکار دئینن د گۆتنا وانێدا؟

# ژن و مێر د مافاندا د یەکسانن

ل بەشەکێ بەندێ (٣)ێ رێکەفتناما تایبەت ب مافێ ئابووری و کۆمەلایەتی دا هاتیە: (دەولەتێن لایەن د ڤێ بەیانناما ڤێگاڤێ دا سوزێ ددەن ژن و مێر یەکسانبن د مافان دا).
د بنەرەت دا دڤێت ژن و مێر د ماف و ئەرکاندا د یەکسان بن، ئەڤ جودابوونا ڤێ گاڤێ ل بەشەکێ کۆمەڵگەهێن مرۆڤایەتیێ دهێتە بکارئینان ژ چێکرنا مرۆڤی بخویە و بێ داوی نینە، دڤێت ژن و مێر ب یەکسانی بەشداریا چالاکیان بکەن بۆ برێڤەبرنا ژیانا خۆ و ب یەکسانی دەرفەت لبەروان بهێتە ڤەکرن ل هەموو وارێن ژیانێ وەك (کارکرن - بەشداریا رامیاری - برێڤەبرنا کاروبارێن گشتی)

## راهێنان

١- ئەرێ باوەریاتە ئەوە کو ژن و مێر د مافیدا یەکسانن؟
٢- ئەرێ دبیت دەرفەتا یەکسان بۆ کارکرن و وەرگرتنا پلە و پایە دناڤبەرا ژن و مێرادا هەبیت؟
٣- ئەرێ باوەریاتە ئەوە کو ژن و مێر د مافێ رامیاریدا وەك مافێ هەلبژارتنێ د یەکسانن؟
٤- ئەو ئەگەر چنە کو دبنە ئەگەرێ جوداهیبوونێ ل ناڤبەرا ژن و مێراندا؟ تە باوەری پێ هەیە؟

## چیرۆك:

ل دەمێ سەرەدانا مامێ حەسەن بۆ دەڤ نوژداری ئەڤ دان و ستاندنە هاتە کرن:

نوژدار: حەجی بخێر هاتی، ناڤێ تە چیە؟

مامێ حەسەن: ناڤێ من (مامێ حەسەنە)، هەڤژینا من ناڤێ وێ (رەوشەنە) و یا نەخوشە.

نوژدار: (رەوشەن خان) تە چیە؟

رەوشەن خان: هەموو لەشێ من دئێشیت.

پشتی پشکنینێ، نوژداری گۆت: ئەگەرێ نەخوشیاتە کارکردن و وەستیانە.

مامێ حەسەن بەرسڤدا و گۆتێ: هەڤژینا من کابانیا مالێ یە و چ کارا ناکەت، ئەڤجا دێ ب چ وەستییێت.

نوژدار: هەوە چەند زارۆك هەنە؟

مامێ حەسەن: ٩ زارۆك.

نوژدار: (رەوشەن خان) رۆژێن خۆ چەوا دبورینی و سپێدەهیا کەنگی رادبی؟

رەوشەن خان: سپێدەهیا بەری بانگدانێ رادبم، تەرش و تەوالێ مە دەردئێخم و جهێ وان پاقژ دکەم، پاشی خارنا سپێدێ چێدکەم و دەمە زارۆکا، لدویفدا مەشکێ د هەژینم و مالی پاقژ دکەم و جلکا دشوم، ئاڤێ ژ کانییێ دئینم و خارنا نیڤرۆ بەرهەڤ دکەم و بۆ حەسەنی دبەمە سەر کاری.

نوژدار: تو نیڤرۆیا ناچیه مال؟

مامێ حەسەن: نەخێر ژ دەرڤە مژوولێ بژارەکرنێ مە.

نوژدار: پشتی هینگێ چ دکەی؟

رەوشەن خان: پشتی هاریکرنا حەسەنی د بژارەکرنێ دا ڤەدگەرمە مالێ، خوارنا شیڤێ ئامادە دکەم. ب شەڤێ پشتی ڤەگەریانا تەرشی ددۆشم.

نوژدار: مامێ حەسەن، تو نا بێژی هەڤژینا من چ کار نینن و کار ناکەت؟

مامێ حەسەن: ئاخری ژنا بەر مالێ یە!!! کارێ چ دکەت؟

**پرسیار:**

١- ب هزرا هەوە ئەو ژنکە کار دکەت یان یا بێ کارە؟ چەند دەمژمێرا کاردکەت؟

٢- چ وەل مامێ حەسەن کر کو بێژیت هەڤژینا من یا بێ کارە؟

٣- بەرامبەریەکێ بکە دناڤبەرا کارێ مامێ حەسەن و کارێ هەڤژینا وی دا؟

٤- ئەرێ مێر کارێ دناڤ مالێ دا دکەن؟ ئەو چ کارە دکەن؟

٥- تو هەست پێ دکەی کو د خێزانا تە دا جوداهیەك دناڤبەرا کچ و کورا دا هەیە؟

# جوداهی نەکرن بەرامبەر یاسایێ

مرۆڤ هەبویەکێ کۆمەلایەتیە و نەڤێت بتنێ بژیت و دڤێت د کۆمەلگەهەکێ دا بیت، پێدڤیە رێکخستنا پەیوەندیێن (ئەرك و مافا) د چارچوڤێ یاسا و تیتالان دا رێک بێخیت.

یاسا، ئەوە کو پەیوەندی و رەفتارێن خەلکی دیار دکەت و رێک دئێخیت، پێدڤیە د گشتی بن و لسەرچ بنەمایێن جیاواز دناڤبەرا کەسەکی و کەسەکێ دی نەهێتە دانان. جوداهیکرن دێ بیتە ئەگەرێ بنپێڤەدانا ئەڤی مافی ژ لایەکی و ژ لایەکێ دیڤە گیانێ هەڤرکیێ و شەری بەلاڤ دکەت و نە ئارامیێ دئێخیتە دناڤ وەلاتی دا.

ل هەموو وەلاتان پێدڤیە یاسا سەروەربیت، ئانکو کەس ژ یاسایێ بلند تر نەبیت، یاسا جوداهیێ ناکەت دناڤبەرا مرۆڤاندا، بەندێن وێ ژی پارێزگاریا مافان دکەن نەکو بنپێ دکەن.



ژ بەر گرنگیا ڤی مافی جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی د چەند بەندەکان دا جەخت (تاکید) لسەر کریە و دبێژیت:
هەر کەسەك ل هەر جهەکی بیت مافێ دانپێدانا کەسایەتیا یاسایی یا هەی، هەموو مرۆڤ بەرامبەری یاسایێ وەکی ئێکن مافێ وێ چەندێ یێ هەی وەك ئێک و بێ جوداهی ژ لایێ یاسایێ ڤە بهێنە پاراستن.

## راهێنان

- ئەرێ یاسایا وەلاتێ تە یەکسانیێ ل ناڤبەرا هەڤوەلاتیاندا دەستەبەر دکەت؟
- هەست پێ دکەی رێنمایێن خاندنگەها تە جوداهیێ دناڤبەرا قوتابیاندا دکەت؟

هەمی قوتابی ڤێ چیرۆکێ چەند جارەکان بخۆینن (چێدبیت کار پێ بکەن ب شێوێ زارڤەکرن).
خاتون رۆزا پارکس خەلکا بازێرێ مونتگمریە ویلایەتا ئەلاباما یا ئەمریکا کارێ جلک دروونێ دکر... و یا رەش پیست بوو ل ١٩٥٥/١٢/١، لناڤ بازێرێ مونتگمری ل ئەمریکا سیاری ئوتومبێلەکا نەفەرا بوو خاتون روزا پێگیر نەبو بۆ یاسایا (جیم کرو) کو پێدڤیبو مرۆڤێن رەش پیست کورسیکێن لسەر روونشتین بۆ سپی پیستان چۆل بکەن، خاتون رۆزا ب گونەها شکاندنا وێ یاسایا جوداکەر هاتە دەستەسەرکرن، ژ ئەگەرێ ڤێ روودانێ کێشا (بایکوتی پاسێن مونتگمری) پەیدابوو. دەنگوباسێن گرتنا رۆزا پارکس ل ناڤ بازێریدا بەلاڤبوو، مرۆڤێن رەش هندەك چالاکی دژی یاسایا (جوداکرنا رەش و سپیان) ئەنجامدان.

(مارتن لوسەر کینگ) کو وەزیر بوو پشتەڤانیا ڤان چالاکیا کر، ئێک ژوان چالاکیان ئەوبوو مرۆڤێن رەش بریار دا سیاری پاسا نەبن و ب پیا هاتن و چوونێ بکەن...
کومپانیا هاتن و چوونێ ٦٥٪ ژکاری ژدەست دا و شوفێر ژسەر کارێ وان لادان ب ڤی رەنگی هەڤرکیەکا ئاشتیانە یا دوور ژ توند و تیژیێ بۆ بدەستڤەئینانا مافێ مرۆڤی دەست پێکر.
ل سالا ١٩٥٦ دادگەها بلند ل ئەمریکا ئەڤ یاسایا جوداکرنا رەش و سپیان ب سەرپێچیا دستووری دانا. کومپانیا هاتن و چوونێ ل باژێرێ مونتگمری رازی بوو شوفێرێ رەش دابمەزرینیت و بێخیتە سەر کارێ وی، ب یەکسانی و بێ جوداهی دگەل هەموو ئاکنجیا کارکر.

## پرسیار:

- بۆچوونا تە چیە بەرامبەر گۆتنا رۆزایێ؟
- مرۆڤێن رەش ل باژێرێ مونتگمری داخازا چ مافی دکرن؟
- بۆچوونا تە بەرامبەر ڤێ یاسایێ یا چاوایە؟ ئەرێ ئامادەی پشتەڤانیێ یان هەڤرکیێ بۆ ڤی جۆرێ یاسایێ بکەی؟
- مرۆڤێن رەش ژ بۆ وەرگرتنا مافێ خۆ شێوازێ چەکداریێ هەلبژارد یان شێوازێ هەڤرکیا ئاشتیانە؟ تو کیژ شێوازی پەسەند دکەی؟
- ئەرێ تە جۆرە روودانەکا هوسا گوه لێ بویە ل وەلاتێ تەدا

بەرامبەر یاسایێ جودا بوو نەك لناڤبەرا هەڤوەلاتیاندا هەبیت.

# مافێ مولكداریێ

بەندێ (١٧):
هەموو كەسان مافێ مولكداریێ یێ هەی چ یێ بتنێ بیت یان هەڤ پشك بیت ل گەل خەلكەكێ دیدا نابیت ب زۆری مولك ژ چ كەسان بهێتە ستاندن.
ب دەستڤە ئینانا مولك و مالی پشكەكە ژ پێدڤیێن ژیانێ بۆ بەردەوامدان ب خوشكرنا ژیانا مرۆڤی. ئانكو بكارئینانا وان تشتێن خودانی لێ دهێتە كرن بۆ بەرژەوەندیا مرۆڤان، لەوما سادەترین مافێ مرۆڤی ئازادیە بۆ مولكداریا مولكێ نەهێتە ڤەگوهاستن یان بهێتە ڤەگوهاستن، دشێت بكار بینیت و مفای ژێ وەربگریت دڤێرێدا یاسا رۆلێ رێكخەری دبینیت، ب جۆرەكی كو پاراستنا یاسایێ بۆ مافێ مولكداریێ مسوگەر بكەت و ژ دەست درێژیا بپارێزیت.

## چالاكی:

مامۆستا د وانا مافێ مرۆڤیدا بەندێ (١٧) جارناما جیهانی یا مافێ مرۆڤی بۆ قوتابیان شلوڤە دكر، كۆ تێدا هاتیە: (هەموو كەسەكی یان خێزانەكێ مافێ مولكداریا تایبەتا خۆ یا هەی) رۆنكر كو چ دەسهەلات نەشێت مولكێ چ كەسی ژێ بستینیت.
قوتابیەكی دەستێ خۆ بلند كر و گۆت (وەیە مامۆستا؟ ئەم خەلكێ كەركیكێ نە حكومەتا عیراقێ مولكێ مە یێ داگیر كری)
قوتابیەكێ دی ... ب سەدان گوند ژ ناڤبرن و ب هزاران مالێن دەربەدەر كرین.

ماموٚستا: ئەوا هوون دبێژن هەموو راستە، بەلێ دڤێت بزانن ئەڤ کارە هەموو بنپێڤەدانا هەمی مافێن هەوە بویە و روٚژەکێ دڤێت چ ماف ژ مافێن هەوە نەهێنە بنپێکرن قەرەبوویەکا تمام ل بەرامبەری وان بنپێڤەدانا بهێتەدان.

## پرسیار:

١- ئەرێ مروٚڤ ژیێ وی هەر چەند بیت، مافێ مولکداریێ هەیە؟
٢- چێدبیت ژ بەر هەر ئەگەرەکێ مولکێ هەر کەسەکی ژێ بستینن؟
٣- دەولەت دێ شێت ب بەرەلایی (عشوائی) مولکێ هەڤوەلاتیەکی داگیر بکەت؟
٤- چاوا قەرەبوویا بنپێڤەدانا ئەڤی مافی بهێتە دان؟

# مافێ گەلا و نەتەوا
# ل دیارکرنا چارەنڤیسیدا

کۆمەلێ مرۆڤایەتیێ ژ نەتەوێن جودا جودا پێکدهێت، گەلەك ژ نەتەوا خودان قەوارەکا سیاسینە کو دبێژنێ دەولەت. هندەك ژ دەولەتان پتر ژ نەتەوەیەکێ تێدا دژین. لدویف پەیمانا نەتەوێن ئێکگرتی هەموو گەلا مافێ دیارکرنا چارەنڤیسێ خۆ یێ هەی. دڤێت بارودوخەك ل بەرامبەری وان بهێتە پەیداکرن دا بشێن قەوارەکا سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی بۆ خۆ ل چارچۆڤێ دەولەتەکێدا دروست بکەن.

## راهێنان

مامۆستا قوتابیێن پولێ دابەش دکەت لسەر سێ گروپان، ب ڤی شێوێ ل خوارێ:

گروپێ ئێکێ: گروپێ سەربەخۆ.

گروپێ دوی: گروپێ فیدرالی.

گروپێ سیێ: گروپێ مافێ مرۆڤی.

هەر گروپەك ڤان کارا ئەنجام ددەت:

گروپێ سەربەخۆ: وان ئەگەرا روون بکەت ئەوێن بۆینە ئەگەرا هەلبژارتنا بیرۆکا سەربەخۆیی یا گەلێ وان.

گروپێ فیدرالی: وان ئەگەرا روون بکەت ئەوێن بۆینە ئەگەرا هەلبژارتنا شێوەیێن فیدرالی بۆ گەلێ وان.

گروپێ مافێ مرۆڤی: وان بەلگەناما و رێککەفتننامە روون بکەت کو پشتگیریێ ل دیارکرنا مافێ چارەنڤیسێ گەلان دکەت، ل دوماهیا گفتوگۆیێ شێوازێ ریفراندومێ ل ناڤبەرا هەموو قوتابیاندا بهێتە کرن ب ئارمانجا دیارکرنا چارەنڤیسی.

# مافێ پاقژیا ژینگەهێ (پاراستنا ژینگەهێ)

ژینگەهـ ئێک ژ بنەمایێن سەرەکیێن هەبوونێ یە، پێدڤیە بۆ بەردەوامیا ژیانێ بهێتە پاراستن و پاقژیا وێ بهێتە راگرتن. ژینگەهـ بۆ هەمیانە و ب مولکێ مرۆڤایەتیێ دهێتە دانان و بەهرا هەمی زیندەوەران تێدایە. دڤێت مافێ مە بیت داخازا راگرتنا پاقژیا وێ بکەین و نەهێلین ب شێوەکێ نە دروست بۆ بەرژەوەندیا وان کارگەها و دەولەتا بهێتە بکارئینان. ئەوێن کو ژ بەریک پرکرنێ و ژ بەرژەوەندیا خۆ زێدەتر، هزر ل ژیانا بەرەبابێن بهێن ناکەن. ژینگەهـ ژێدەرێ هەموو سروشتیانە (ئاڤ - با - ئاخ - کانزا - زیندەوەر) هەموو وان تشتا ڤەدگریت کو ل بن ئاخێ و ل ئەسمانی دا هەنە، هەر ئێک ژ وان ژێدەرەکێ سەرەکی یێ ژیانێیە پیسبوون و تێکدانا وان کارەکێ خراب بۆ مرۆڤایەتیێ ژێ پەیدا دبیت... دیتنا ژێدەرێن وزێ (هێزا هلمێ - رەژیا بەری - باroوت - کارەبا - نەفت - ئەتۆم - ... هتد) و بکارئینانا وان ل کارێن جودا جودایێن پیشەسازی دا پاشی دروستکرنا چەکی و گەلەك جارا دەولەتێن هێز مەزن بەرێ و نوکە کارکریە بۆ داگیرکرن و دەستدانانا سەر وان دەڤەرا کو ئێک یان چەند ژێدەرێن وزەی تێدابن، گەلەك شەر و شور پەیدابووینە و هەموو جۆرێن چەکی تێدا هاتینە بکارئینان و ئێک ژی خۆ نادەتە پاش ژ دروستکرنا چەکێ گران و دورندە و بکارئینانا وان، بێ گومان ئەڤەژی پیسکرنا ژینگەهێ ژێ چێدبیت.

زێدەبوونا مرۆڤان و پێشکەفتنا بازرگانیێ دناڤبەرا دەولەتاندا گۆیا ئەردی کرە بازارەکێ مەزن هاتن و چوون و سەفەرکرن

**یا** بۆیە کارەکێ رۆژانە، ژ ئەگەرێ بکارئینانا (ئوتوموبیل - شەمەندەفر - پاپور - فروکە... هتد) کو هەر ئێک بەهرا خو ژ وزەی بکار دئینیت و ژینگەهێ پیستر دکەت، و ژ لایێ ساخلەمیێ ڤە زیانەکا گەلەك ب زیندەوەری کو مرۆڤ ژی ئێک ژوانە دگەهینیت. ل پرانیا دەولەتێن پێشکەفتی ل جیهانێ کو پیسبوونا ژینگەهێ بۆیە ئاریشەکا مەزن، هەولددەن ل ناڤ باژێرادا کێمتر ئوتوموبێلا بکار بینن. هەموو سالا رۆژەکێ بۆ نەهاژوتنا ئوتوموبێلا تەرخان دکەن. باجێن ئوتوموبێلا زێدەدکەن و کرێیا پارکێن ئوتوموبێلا گران کەن، و خەلکی پالدەن بۆ بکارئینانا پایسکلا ل ناڤ باژێرا. هاتن و چوونا ترومبێلا ل ناڤەندا باژێری قەدەغە دکەن...
ئەرێ تە چ پێشنیار هەیە بۆ کێمکرنا ئەڤێ دیاردێ:
رۆژانە هەر خێزانەك خۆ ژ بەرمایی و پیساتیا مالی رزگار کەت. وەکی دهێتە زانین، باژێرڤانی وی بەرماکی ل جهەکێ دوور ژ باژێری کوم دکەت یان دسۆژیت و ئەڤەژی دبیتە ئاریشەکا دیا پیسکرنا ژینگەهێ... ل دەمێ سۆتنێ چێدبیت گەلەك تشت تێدا بن و سۆتنا وان تشتا خرابی ژێ پەیدا دبیت و زیانەکا مەزن دگەهینیتە ساخلەمیێ. ژبەرهندێ هندەك وەلات ل پشکا پاقژیێ ل باژێرڤانیا باژێری، بەلاش سندوقا لسەر خێزانا دابەش دکەن و شیرەتا لی دکەن کو ئەو تشتێن ژ ئەنجامێ سۆتنێ جۆرەکێ گازا ژەهراوی و ترس ژێ دەردکەڤیت، ژ بەر هندێ پاڤێنە ناڤ وان سندوقا و رۆژەك بۆ کومکرنا وان دێ هێتە دیارکرن، دا کو برێکەکێ بهێتە ژناڤبرن و زیانێ نە گەهینیتە زیندیا... هندەك وەلاتێن سەردەریایێ، بەرماك و پیساتیا دکەنە دناڤ دەریایێ دا ئەڤەژی زیانەکا مەزن دگەهینیتە زیندەوەرێن دناڤ دەریایێ دا.
ل دەڤ مە ژی هندەك کەس بۆ نێچیرا ماسیا نارنجوکا دهاڤێنە دناڤ کومەکا ئاڤێ دا و چ ماسی هەیە مەزن و بچووك دهێتە

کوشتن، هندەك جارا، ژبەر هەر ئەگەرەکێ ئەگەر ئوتومبێلێن گلێشی ل دەمێ خۆدا نەهاتن، هندەك ژ ئاکنجیێن کولانێ، بێ گوه بدەنە کەسێ، بەرماکێن خۆ دهاڤێژنە رەخەکێ تاخێ خۆ!! تو بۆ ڤێ چەندێ چ دبێژی؟ بۆ چارەسەرکرنا ئاریشەکا ژ ڤی جۆری تە چ پێشنیار هەنە؟

کارگەهێن پێشەسازی، ژبلی وێ گازا دناڤ بای دا بەلاڤ دکەن، ژناڤبرنا بەرماکێن وان، یا بویە ئاریشەکا مەزن پێدڤیە کار بۆ بهێتە کرن... هەبوونا کارگەها نێزیک باژێر و باژێرك و گوندان، زیانەکا مەزن دگەهینیتە ئاکنجیێن دەڤەرێ، ئەڤجا پێدڤیە هەموو کارگەهـ دووربن ژ تاخ و مالا و زیانێ نە گەهیننێ.

ژ ڤان هەمیا گرنگتر، ئەو کارگەهێن کو د وارێ ئەتۆمی و کیمیایی و هندەك تشتێن ژ ڤان بابەتا کاردکەن، نوکە بەرماکێن ڤان کارگەها یێن بۆینە ئاریشەکا مەزنا مرۆڤایەتیێ و چەندین رێکخراو و پارت بۆ رێگرتن ژ هەبوونا ڤان جۆرێن کارگەها دامەزراینە، و پارتا کەسک کو د پتریا وەلاتێن ئەوروپا دا یا هەی دژی وان کارگەهـ و حکومەتان دراوەستیێت، کو بەرماکێن مەترسیدارێن کارگەهێن خۆ دئێخنە بن ئەردی یان د دەریا دا...

پاراستنا ژینگەهێ وەکو مافەکێ مرۆڤی کو دگەل وەرارا کۆمەڵگەها و پیشەسازی پەیدابوویە، گرنگییەکا مەزن یا هەی ژبەر کو بابەتەکە هەمی مرۆڤایەتیێ ڤەدگریت، نوکە پیتەکێ زێدە پێ دهێتە دان و بەردەوام خەلک پێشڤە دچیت، ئەرێ تۆ نابیە ئێک ژوان پشتەڤانا؟

## ڕاهێنان

١- ژێدەرێن پیسکرنا ژینگەهێ چنە؟
٢- ئەرێ هەمی د بەرپرسیارن ژ پاراستن و پاقژیا ژینگەهێ؟
٣- بۆ راگرتنا پاقژیا ژینگەهێ تو چ ب پێدڤی دزانی کو هەر کەسەك بکەت؟
٤- هزرا تە چیە بەرامبەر هەبوونا دام و دەزگەهێن ژینگەهپارێزیێ کو کارێ وان پاراستنا ژینگەهێ یە؟
٥- تو دێ چ کەی بەرامبەر وان لایەنا کو ب شێوێن جودا جودا ژینگەهێ پیس دکەن؟ ب دیتنا تە پیدڤیە دوڤچوون و سزایێن یاسایی بدەنێ؟

ئەڤ پروگرامە بە سەرپەرشتیا رێکخراوا (NPA) و ب کارەکێ هەڤپشکی ل گەل ڤان رێکخراوێن ل خارێ و ب پشکداریا هەردوو وەزارەتێن (پەروەردە، مافێ مرۆڤ و ئاوارە و ئەنفال) گەلالە بوویە.

## ناڤێن لایەن و پشکدارێن پروژەی:

ڕێکخراوا فریا گوزاری یا گەلێ نەرویجی (NPA)، (بەختیار ئەحمەد صالح و ئارام محەمەد عەلی)

وەزارەتا پەروەردێ (عوسمان عەزیز عەلی)

وەزارەتا مافێ مرۆڤی و ئاوارە و ئەنفال (زانا جەمال حەمە عەلی)

ڕێکخراوا گەشەپێدانا مەدەنیەتی(CDO) (شلێر ئەحمەد حچر)

پەیمانگەها کوردی بۆ هەلبژارتنێ (پولا ئەحمەد)

لاندکا زارۆکێن کوردستانێ (بورهان عەبدولرەحمان مستەفا)

ڕێکخراوا (DHRD) (دالیا عەبدوللا ئەحمەد فەهمی)

ڕێکخراوا گەشەپێدانا ئابووریاکوردستانێ(KEDO) (شادان عومەر عەبدولرەحمان)

ڕێکخراوا (PAO) (ڕەفیق تەوفیق)

## چەند شیرەتەکێن سلامەتیێ بو خو پارستن ژمین و تەقەمەنیان



بێ پرسیارکرنێ نەچە دەڤەرەکێ کو تێدا شارەزا نین.



بەروتشتێت دی نەهاڤێژە مین و تەقەمەنیان



**یاریکرن ب تەپێ باشترە ژ یاریکرنێ ب چەکێ زارۆکان**






## یاریا ب مین و تەقەمەنیا و دەمانجێ نەکە یاریا ب تەپێ بکە



# چەند رێنماییێن گرنگ

## بەری ژ مال دەرکەڤی:

- بزاڤێ بکە پێزانینێن تەمام و دروست ژ کەسانێن شارەزا وەربگری. سەبارەت ب هەبوونا مین و تەقەمەنی ل وێ دەڤەرا دچییێ.
- ئاگەهداریا کەسانێن نێزیکی خۆ بکە لدور دەرکەفتنا تە.
- هەکە تو چوویە گوندەکی یان دەڤەرەکا دی پرسیارێ ژ ئەنجومەن یان کەسێن شارەزا بکە.
- بو بجە ئینانا کارەکی ل جهەکی کو تێدا شارەزانینی باشتر ئەوە کەسەك دگەل تە بیت
- پێدڤیا وەك مۆبایل و ئاڤ و خوارنێ دگەل خۆ ببە؟
- پێدڤییە بزانی کو مۆبایلا تە یا شەحنکریە، سەنتێن پێدڤی ژی تە هەبن.

## ل دەمێ چوونێ و بجهـ ئینانا كارى:

ب چ چالاكیان نەرابە ل دەڤەرێن مەترسیدار.

گەلەك ب هشیاریڤە سەحا دەوروبەرێن خۆ بكە و دەڤەرێن مەترسیدار هشیاربە.

د وان رێكارا هەڕە ئەوێن خەلك تێرا دچن ئانكو رێكێن گشتینە.

هەكە تە شكەك ژ رێكەكێ یان دەڤەرەكێ بر تێرا نەچە بزاڤێ بكە بەرى تاریبوونێ بڤەگەریە مالێ